زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی حەوتەم

عەلی باپیر

# قوتابییانی زانیاری شەرعی و

# چەند ڕەنج و ڕێنماییەک

نوزاد

# قوتابیانی زانیاری شەرعی و چەند ڕەنج و ڕێنماییەك

علی باپیر




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

# ئەم نامیلکـــەیە

لەم نامیلکـــەیەدا لە چوار تەوەرەداو لە بەر ڕۆشـــنایی قورئـــان و سوننەتدا باسی: گرنگی و بایەخی زانیاری شەرعیی‌و، پلەو پایەی بەرزی ئەهلی عیلم‌و،کە سایەتی فەقێ‌و قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و، ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بە خەڵك‌و کۆمەڵگایان کراوە، هیواداریشم بەم نامیلکەیە سوودێکم بە فەقێ و قوتابییانی بێنازی زانیاری شەرعیی کورد ستان گەیاندبێ‌و دەستبارێکی خێرم بۆ گرتبـن لەو ئەرکە قورس و پیرۆزەی سەرشانیان دا.



﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ (التوبة -١٢٢)

# پێشکەش بێ

بە فەقێو قوتابیانی خۆشەویستی زانیارییە شەرعییەکان، ئەوانەی کە مەردانە قۆڵی بە دوای زانیاری شەرعیدا گەڕانیان هەڵماڵیوەو عەزمیان جەزم کردوە لە سەر چاك تێگەیشتنی قورئان و سوننەتو باش ئاشنا بوون بە شەریعەتو پاشان بەرچاو ڕوونکردنەوەو تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵك و میللەت.

# پێشــەکــی

خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت لە ئەسڵدا وتارێك بووە کە لە مانگی (٧ ی ٢٠٠٦ )دا لە کۆڕێکـی تایبەت بە فەقێو قوتابییانی زانستە شەرعییەکان، دراوەو پاش هێنرانە سەر کاغەزی(١)و چاوپێدا گێڕانەوەی خۆم بەم جۆرەی لــێ هاتوە.

ئاشکراشـــە کە گرنگی پێدان و خەم لێخـواردنی ئەو فەقـــێ و قوتابییانەی هەوڵی وەدەست هێنانی زانستە شەرعییەکان دەدەنو لە داهاتوودا دەبنە زاناو پێشەواو ناهێڵن میحرابو مینبەرەکان بە چۆڵی بمێننەوە، ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانێکی دڵسۆزی دینەکەیەتی، جا ئەو گرنگی پێدانو خەم لێخواردنە بەهەر شێوەیەك بێ هەر لە هاندانو ئامۆژگاریکردن و ڕێنماییکردنەوە بگرە، هەتا هاوکاریکردنو کار ئاسانییو یارمەتیدانی ماددی و... هتد. چونکە لەڕاستیدا ئەو فەقێو قوتابییانە چ لەکاتی بەدوای زانیاری شەرعیی گەڕانیان وە چ لە دوای ئیجـــازەو بڕوانامەی مامۆستایەتی وەرگرتن دەوربینینیان لە مینبەرو میحرابی مزگەوتەکاندا، بە یەکێك لە ئەرك و فەرزە شـەرعییەکان هەڵدەستن کە فەرزی کیفـایەیەو بە چواندنی تێکڕای مسوڵمانان گوناهبار و بەرپرسیار دەبن.

---

(١) (محمد)ی کوڕم هێناویەتە سەر کاغەز خوا بە کەرەمی خۆی سەلامەت و سەرفرازی دونیاو دواڕۆژی بکات .

جا ئەم نامیلکەیەش هەر هەنگاوێکە لەو ڕێیەدا کە هەوڵم داوە کۆمەڵێك ڕێنمایی و ئامۆژگاری تێدا ئاراستەی ئەو گەنج و لاوە ڕۆح سووك و خوێن شیرینانە بکەم، کە بە شێکی باشی تەمەنی لاویتی‌یان تەرخان دەکەن بۆ شارەزا بوون لە شەریعەتی خواو پەروەردە بوون لە باوەشی قورئان و سوننەت و لەبەردەستی زانا پێشەوایاندا تاکو لە داهاتوودا ئەوانیش ببنە چاوساغ و پێشەوای خەڵك وکۆمەڵگایەکەیان و نەهێڵن مینبەر و میحرابی ماڵەکانی خوا چۆڵ وخالی بن.

خواش (تبارك وتعالى) بە بەزەیی و بەخشــشی بێسنووری خۆی یارمەتی خەڵكو میللەتە مسوڵمانەکەمان بدات کە بە هەموو چین‌و توێژەکانییەوە بە گشتی‌و بە تایبەت دامودەزگا بەرپرسەکانی، هاوکارو دەستبارگرێکی دڵسۆزو جیددی ئەهلی عیلم بن، چونکە بێگومان (دین) هەوێنی (ژین)ەو (شــەریعەت) هەناوی (میللەت)ە وەك خوای زاناو پەنهانبین فەرمووییەتی: ﴿ وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ (الشورى -52) واتە: وە هەر بەو شێوەیە ☐ کە وەحیمان بۆ پێغەمبەران ناردوە- ڕووحێکیشمان لە ئایینی خۆمان بۆ لای تۆ نارد، تۆ پێشتر نەتدەزانی نە کتیب چیە نە ئیمان، بەڵام ئێمە ئەو وەحییەی خۆمانمان گێڕا بە ڕووناکییەك کە هەرکام لە بەندەکانمان بما نەوێ پێی ڕێنمایی دەکەین، بێگومان تۆ بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنمایی- خەڵکی- دەکەی.

شتێکی ڕوونیشە ئایینو بەرنامەی ڕاستو بێهەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ (عــزّوجل) ئەگەر وەك خۆی و لە دوو تاکە سەرچاوە ڕوونو بێ چەندو چونەکەیەوە دەرك نەکرێو فام نەکرێ، نا شـگونجێ بە شێوەیەکی ڕاست و دروســـت پابەندیی پێوە بکرێ و پیادە بکرێ.

جا هەرچەندە هەموو مسوڵمانێك لەسەری پێویستە بایی ئەوە کە بە شێوەیەکی ڕێك و ڕاست دیندارییو مسوڵمانەتیی خۆی ئەنجام بدات، لە ئیسلام شارەزا بێ. بەڵام بێگومان پێویستیش بە کەسانێکی پسپۆڕ (متخصص)و تەرخان (متفرغ) هەر دەکات کە هەوڵبدەن لە سەرجەم بوارەکانی دینداریی‌دا ڕێنمایی خەڵك و کۆمەڵگاکەیان بکەن و ڕۆشنی بکەنەوە.

هیواداریشم ئەم نامیلکەیە ئەو ئامانجانەی بۆی لەبەرچاو گیراون بیانهێنێتە دی.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك

1427 / 10 / 6

2006 / 10 /28

هـــەولێر

# ڕوونكـردنەوەیەك

مەبەستمان لە ووشەی شـەرع (شرع) لەم نامیلكـــەیەدا مانا قورئانییەكەیەتی وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿...لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا...﴾ (المائدة-٤٨).

وشەی شەرعیش لە قورئاندا مەگەر چۆن دەنا مەبەست پێی ئەو ئایینو بەرنامەیە كە خوای كاربەجێ بۆ پێغەمبەری كۆتایی خۆی (محمد )ی ناردوەتە خوارەوەو ئەویش لە دوو تویێی قورئان سوننەت دا بەرجەستەیە، كە یەكەمیـان (متن)ی ئیسلام و دووەمیـان (شـرح و بیان)یەتی، كەواتە: مەبەست لە وشەی (زانیاری شەرعیی)یان (زانیارییە شەرعییەكان) یان (زانستی شەرعیی)ش، ئەو جۆرە زانیارییانەن كە دەبنە مایەی بەرچاو ڕوونبوونەوەی مرۆڤ دەربارەی ئیسلام و لێتێگەیشتنی و شارەزابوونی، جا چ ئەو زانیارییانە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە قورئان و ســوننەتەوە هەبێ وەك: تەفسیرو شەرحی سوننەت و(فقە)و (علوم آلقران)و (علوم الحدیث) یان بە چۆنیەتی لێتێگەیشتنی قورئان و سوننەتەوە، وەك(أصول الفقە)، یان بە فێربوونی زمانی عەرەبی یەوە- كە دیارە بەبێ شارەزابوونی عەرەبی ڕێگای شارەزابوون لە قورئانو سوننەتمان وەك پێویست نیە- وەك (نحو)و (صرف)و (بلاغة)..

ئنجا بە پێی بنچینەی شەرعیی (القاعدة الشرعیة): (للوسائل حكم المقاصد) "هۆكارەكان هەمان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە"وە

بنچینەی: (مالا یتم الواجب الاّ به فهو واجبٌ) "هەر شتێك فەرزێك پەكی لەسەری بكەوێ، فەرزە"، هەموو ئەوجۆرە زانیارییـــانەی كە پێویستن بۆ لێتێگەیشتنی قورئان و سوننەت و شارەزابوونی ئیسلام چ پەیوەندی نزیك و ڕاستەوخۆیان هەبێ بەوەحییەوە، چ دوورو ناڕاستەوخۆ، هەموویان بە زانیاری شەرعیی لەقەڵەم دەدرێن. بەڵام بێگومان وەسیلەو هۆكار بۆ غەیری خۆی پێویستە نەك لەبەر خودی خۆی، بۆیە پێویستە مرۆڤــ لەو بارەوە وریا بێ و تەنها هێندەی پێویستە خەریكی بێت و لەبیریشی نەچێ كە وەسیلەو هۆكارەو ئامانج نیە!

پێشم وایە ئیمام شــافیعی "خوا لێی خۆش بێ" بەم شیعرەی هەر ئەوەی مەبەست بووە:

كل العلوم سوى القرآن مشــغلة وســوى الحديث والفقة في الدين

العلم ماكان فيه (قال)،(حدَّثنا) سوى ذلك وسواس (الشياطين)

واتە: بێجگە لە قورئانو سوننەتو تێگەیشــتن لە دیــن، تێكڕای زانیاری یەكان تەنیا مایەی سەرقاڵیی‌و سەرگەرمیین.

زانیاری (واتە زانیاری شەرعیی) ئەوەیە كە " فەرمووی و بۆی گێڕاینەوە"ی تێدا بێ، ئەوی دیكە هەمووی خوتخوتەی شەیتانەكانەو هیچی دی!

دیارە لێرەدا شافیعی(خوا لێی خۆش بێ) دەربارەی زانیاری شەرعیی قسە دەكات، نەك زانیاری (علم) بە گشتی و بەرەهایی. هەر بۆیەش لە پێناسەی زانیاری (علم)دا دەڵێ: ئەوەیە كە " قال و

حدَّثنا"ی تێدا بێ کە وادیارە مەبەستی لە " قال" قورئان و لە "حـدَّثنا"ش سوننەت بێ، چونکە زاراوی زانایان وایە کە دەڵێن: (قال الله تعالى..) کاتێك بیانەوێ ئایەتان بێننەوە، وە دەڵێن: (حدّثنا فلان عن فلان ... عن رسول الله ﷺ ..) کاتێك بیانەوێ دەقێکی سوننەت بێننەوە...

وە پێشم وایە مەبەستی لە (سوى ذلك وسواس (الشياطين)) ئەو حیکایەتو قسەو قاڵ و بیرو بۆچوونانەن کە بەبێ ئەوەی پەیوەندییان بە وەحی یەوە هەبێ بە ناوی "دین"ەوە دەخرێتە ڕوو بە تایبەت لە قاڵبی ڕێبازەکانی (تصوّف)دا!

# دەقــی وتــارەکــە

الحمدلله رب العالمين والصلاه والسلام على جميع الانبياء والمرسلين خصوصاً أفضلهم و خاتمهم محمد و آله أجمعين.

برا ـیانی ـبەڕێزو خۆشەوی ستم ـفەقێو قوتابی ـیانی زان ستە شەرعییەکان:

السلام عليكم و رحمة الله

خۆشحاڵم کە لەم ئێوارە کۆڕەدا بە دیدارتان شاد دەبم و خوا ـئەم کۆڕو کۆبوونەوەیەی ئێمە لەو جۆرە کۆڕو کۆبوونەوانە بگ ـێڕێ ـکە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان لێیان کۆدەبنەوەو دەوریان دەدەن و، بەزەیی خوا دایاندەپۆشێ و ئارامی (ســـکنیە)یان دادەبەزێتە سەرو خوا (عزّوجل) لە لای فریشتە زۆر نزیکەکانی خۆی باسیان دەکات.

بەڕێـــزان:
ئەو بابەتەی کە بۆتانم ئامادەکردوە ناوونیشانەکەی بەم شێوەیە:
" قوتابییانی زانستە شەرعییەکان و چەند سەرنجێك".

جا خوا پشـــتیوان بێ لە چـوار تەوەرەی سـەرەکیدا بابەتـــەکە پێشکەش دەکەین:

**تەوەرەی یەکەم: گرنگـی و بـایەخی زانیاری شـەرعیی.**

**تەوەرەی دووەم: پلە و پایەی داواکەرانی زانیاری شــەرعیی.**

**تەوەرەی سێیەم: کەسایەتی فەقێ و قوتـابی زانیـاری شـەرعیی دەبێ چـۆن بێ؟!**

**تەوەرەی چوارەم: ئەرکی سەرشانی قوتـابی زانیـاری شەرعیی بەرانبەر بە خـەڵك و کۆمــەڵگای.**

شایانی باسیشە کە ئێمە بە پوختیی و گوشراوی قسە دەربارەی هەر کام لەم تەوەرانە دەکەین و دەرفەتی بە دواداچوون و لێکۆڵـیـنەوەی تێرو تەسەلیانمان نیە[1] :

---

[1] لە کتێبی "زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟"دا تا ڕاددەیەکی باش توێژینەوەمان لە بارەی ئەو بابەت و مەسـەلانەوە کردوە، کتێبی ناوبراو وەریش گێڕراوە تە سەر زمانی عەرەبی و بە ناونیشانی: (علماء الاسلام من هم وما هي صفاتهم؟!) و لە لایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ کراوە.

## تەوەرەی یەکـەم : گرنگی و بایەخی زانیاری شەرعیی

زانیاری شەرعیی لە زۆر ڕووەوە گرنگ و بایە خدارەو دەگو نجێ لەوبارەوە زۆر شت باس بکرێ، بەڵام من پێم وا یە ئەو گرنگیو بایەخە لە سێ ڕووەوە لە هەمووی زیاتر بەرجەستەو درەوشایەوە:

یەکـەم: کە لە وەحی یەوە سـەرچاوەی گرتوە:

وەك خوای بەرزو بێ وێنە لەوبارەوە فەرموو یەتی: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ۞ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ وَأَن لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (هود-١٣و١٤)، واتە: یان- بێ بڕوایان- دەڵێـن:- محـمد ﷺ هەڵی بەستوە! بڵـێ دە ئێوەش دە سوورەتی هەڵبەستراوی وەك وی بێنن، وە کێشتان پێ دە کرێ - بۆ هاوکاریتان- بانگیان بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن! جا ئەگەر وەڵامیان نەدانەوە ئەوە بزانن کە -قورئان- بە زانیاری خوا نێرراوەتە خوارێ (بۆیە ناتوانن وەك وی بێنن) وە بزانن - کە بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نینە، جا ئایا ئێوە ملکەچ دەبن! هەروەها فەرموو یەتی: ﴿لَكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلآئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيدًا﴾ (النساء-١٦٦). واتە: خوا شایەتیی لەسەر ئەوە دەدات کە بۆی ناردویە خوارێ، هەروەها فریشتەکانیش شایەتیی دەدەن، وە خواش بەسە بۆ شایەتیی دان.

بەڵێ بەڕێزان

زانیاری شــەرعیی (العلم الشرعی) كە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە لە سەرچاوەی ڕوون و بێچەندوچوونی وەحی خوای (تبارك وتعالی)وە هەڵقوڵیوە بەڵكو بریتیە لە خودی وەحیو زانیاری خوا (سبحانه وتعالی) كە لەڕێی (جبریل)ەوە (علیه السلام) بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دابەزندۆتە سەر دڵو دەروونی پێغەمبەری خۆی ﷺ، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنْ الْمُنذِرِينَ﴾ (الشعراء /١٩٢ -١٩٤)

ئنجا هــەروەكو چۆن خوای پەروەردگــار حیكمەتو بەزەییو دەسەڵاتو... هتدی بێســـنووری هەیە، بە هەمان شـــێوەش زانیاری بێسنووریشی هەیە، بۆیە ئەو زانیارییەی كە لە خواوە دێ " جل شأنه" تۆزو غوباری هەڵەو پەڵەی پێوە نانیشێ، وە بە هیچ جــۆرێك كەموكوڕیو هەڵە ڕوو لە شتێك ناكات، كە لە زانیاری بێ سنووری خوای پەروەردگارەوە سەرچاوە دەگرێ، وەك خوای زانا ناو توانا لە سوورەتی "فصّلت" لە ئایەتی (42)دا دەربارەی قورئــان دەفەرموێ: ﴿لاَ يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلاَ مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾، واتە: لە هیچ لایەكەوە ناهەقیو هەڵە ڕوو لە قورئان ناكات، چونكە لە لایەن خوای كاربەجێی زاناوە نێردراوەتە خوارێ.

بەڵێ قورئانو سوننەت [1] هەقی ڕووتنو بەقەدەر نووكی دەرزی ناهەقی "باطل"یان ڕەگەڵ ناكەوێ.

(1) دیارە مەبەست سوننەتی ڕاست و(صحیح)ەو ئەوەی ڕاستیش نەبێ بە سوننەتو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ دانانرێ.

## دووەم: میــراتی پێغەمبەرانە(علیهم الصـلاة والسـلام) :

دووەم لە ڕووەکانی گرنگی زانیاری شەرعیی ئەوەیە کە میراتی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

ئایا پێغەمبەری پێشـەوا محمد ﷺ چی بۆ ئێمە بە ( میرات) بەجێ هێشتوە؟!

دیارە تاکە میراتێك کە بۆ ئێمەی بەجێ هێشتوە بریتییە لەو زانیارییە شەرعییەی کە لە ژێر ناونیشانی(وحي)دا کۆ دەبێتەوە، وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمایشتێکی خۆیدا زۆر بە ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێت و دەفەرموێ: ((العلماءُ ورثة الانبیاء، وإنَّ الأنبیاء لم یورِّثوا دیناراً ولا درهماً ولکنّهم وَرَّثوا العلم فَمنْ أَخذهُ أَخَذَ بحَظٍّ وافرٍ))[1]، واتە: زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)وە بێگومــان پێغەمبەران نە زێڕو نە زیویان لــە دوای خۆیان بەجێ نەهێشتوە، بەڵکو ئەوەی کە ئەوان بە میــراتیان بەجێ هێشتوە بریتیە لە زانیاری (زانیاری شەرعیی)وە هەر کەسێك زانیاری شەرعیی وەربگرێ، ئەوە پشك و بەشێکی گەورەی پێ بڕاوە).



(1) رواه الترمذي و أبوداود و ابن ماجة والدارمي و أحمد و ابن حبّان.

سـێيەم: زانيـــارى شــەرعيى هيدايەتـــە بۆ تـــاك و بەرنامـــەيە بۆ كـۆمەڵـگـــا:

ڕووى سێيەمى گرنگى زانيارى شەرعيى ئەوەيە كە- زانيارى شەرعيى- هيدايەتە بۆ ئينسان وەك تاك وە بەرنامەشە بۆ كۆمەڵ، وەك خواى زاناو توانا لە ئايەتى(٢٨) سورەتى (الفتح)دا دەفەرمویٚ: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ ﴾[1] واتە:" خوا -جلّ شأنه- ئەو زاتەيە كە پێغەمبەرى خۆى- محمد (عليهم الصلاة والسلام)- ڕەوانەكردوە بە هيدايەتەوەو بە دينى حەقەوە" خواى پەروەردگار ئيسلام دەكا بە دوو بەش.

يەكەم: هيدايەت "بالهدى".
دووەم : دينى ڕاست وحەق (و دين الحق).

كەواتە: ئيسلام دەبێتە دووبەش، بەشێكى ئينسان دەبێ لە خودى خۆيدا جێبەجێى بكات. كە ئەوە پێى دەگوترێ ( هدى) وە ئەمە بەشە كەمەكەيەتى، بەڵام بەشە زۆرە كەى ڕوودەكاتە خەڵك وەك كۆمەڵگاو جەماوەركە دەبێ وەك بەرنامەى ژيان بەڕێوەى بەرن، چا خواى پەروەردگار پێناسەى پێغەمبەرەكەى دەكات كە ئەو دوو شتەى پێدا ناردوون، ديارە ئەو دووانەش بەهەردووكيان ئيسلام پێكدەهێنن كە بريتى بوون لە ڕێنمايى "هدى"و دينى ڕاست و حەق "دين الحق" وەك ئاماژەمان پێكرد.

---

(1) هەروەها هەمان ڕستە لە سوورەتى (التوبة)-33- و(الصّف)-٩-يش دا هاتوە.

بەڵـێ، سێ ڕووی گرنگی و بایەخی زانیاری شەرعیی بریتین لە:

١- زانیاری شەرعیی لە خواوە هاتوە، کەواتە: هەڵەو کەم و کوڕی تێدا نیە.

٢- میراتی پێغەمبەرە"علیه الصلاة والسلام "چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە زانیاری شەرعیی هیچ شتێکی دیکەی بۆ ئێمە بەجێ نەهێشتوە بە دەقی فەرمایشتی خۆی وەك پێشتر باسمان کرد.

3- زانیاری شەرعیی ڕێنمایی یە بۆ تاك و بەرنامەیە بۆ کۆمەڵگا.

## تەوەرەی دووەم : پلەو پایەی بەرزی داواکەرانی زانیاری شەرعیی.

برایانی فەقـــێ و قوتابی!

لە ڕاستیدا لەدوای پلەی پێغەمبەرایەتی بە پێی ئەوە کە لە قورئان و سوننەتدا بۆ ئێمە دەردەکەوێ بەرزترین پلە، پلەی ئەو زانایانەیە کە زانیاری شەرعیی لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) بە میرات دەگرن، بێگومان ئێنسانیش هەتا داوا کاری زانیاری نەبێ نابێتە قوتابی و پاشان نابێتە زاناو مامۆستا. بۆیە هەرچی مەدحێك ڕوو لە زانایان دەکات بەهەمان شێوەش ڕوو لە قوتابیان و فەقێیانی زانستی شەرعییش دەکات، دیارە هەرکەسە بەقەدەر خۆی، هەر بۆیەش لە زۆر شوێنی قورئاندا زۆر بە ڕاشکاویی باسی قوتابیان و داواکەرانی زانستی شەرعیی کراوە، وە لەوبارەوە دەقی قورئان و سوننەت زۆرن، من لێرەدا هەندێکیان بە نموونە دێنمەوە:

١- ئەهـلی زانستی شـەرعیی چ زانا بن چ فێرخوازو چ قوتابی بن چ مامۆستا، هەڵبژاردەی خوای کاربەجێن و کەسانێکن کە خوای پەروەردگار گوڵبژێری کردوون، بۆ وێنە خوای زانا و شارەزا لە ئایەتی (٣٢)ی سوورەتی( فاطر)دا دە فەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ واتە:" دوایی کتێبی خۆمانمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمان

بژاردوون جا ئەوانیش هەیانە ستەمی لە خۆی کردوە، هە شیانە میانجی و میانڕەوە، وە هەشیانە لە چاکاندا پێ شکەوتۆتەوە بە مۆڵەتی خوا، ئائەوەش بەخششی گەورەی خوا یە (دە یدا بە هەرکەسێك کە بیەوێ) وەك دەبینین خوای کار بەجێ ئەهلی عیلمی کردۆتە سێ جۆرو سێ بەش: بەشێکی ناو لـێ ناون "ظالِمُ لنفسه" یانی: تووشی هـــەڵەو کـــەم وکوڕی دەبن و زو ڵم لە خۆیان دەکەن.

بە شێکی دی کەی ناو ناون"مقتـ صد" یانی: وا نین کە فەرمانەکانی خوایان چـواند بێ و قەدەغەکـــانی یان شکاندبێ بەڵام واش نین زۆر هەڵکشی بن و پێش کەوتبنەوە.

بەشێکیشی ناوناون "سابق بالخيرات" واتە: لە چاکەکـــاریی دا پێشکەوتوونەوە، بەڵام هەر سێکیانی بەوە ناوزەد کردوون کە هەڵبژاردەن (الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا) جا لە ڕا ستیدا ئەوە مـوژدەیەکی زۆر خۆشی تێدایە بۆ ئەهلی عیلم، دیارە بە مـەرجێك ئیماندار بن، ئەگەر نا کەسێك کە زانیاری شەرعیی هەبێت و ئیماندار نەبێ، نەك هەر پیێ مەدح ناکرێ بەڵکو لە سەری دەبێتە بەڵگەو لە دوارۆژدا سزاو لـێ پرسینەوەی قورستر دە بێ، کەواتە بابای ئیماندار ئەگەر لەبازنەی ئەهلی عیلم دابێ با کەم و کوڕیشی هەبێ بەڵام خوای بەرزو مەزن (تبارك و تـ عالى) هەر مەدحـــــی دەکات، دیارە لەم ئایەتەدا ڕستەی: "ظالِمُ لنفـ سه" مەبەست پێی ئەو کەسە نیە کە لە ڕێی پێغەمـ بەر (علـ يه الصلاة والسلام) لادەدا، نەء بەڵکو لێرەدا مەبەست لەو کە سەیە

كە لە حەقی نەفسی خۆیدا هەندێك هەڵەو گوناح دەكات، ئەگەرنا كەسێك كە لە ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ لابدات ئەوە نەك هەر ئەهلی عیلم نیە بەڵكو ئەهلی نەفامیی (جهل)ە، وە نەك هەر هەڵبژێراوی خوا نیە بەڵكو ڕەفزكراوی خوایە!

٢- خوای پەروەردگار شـایەتیی دانی زانایانی لەگەڵ شایەتیی دانی خۆی و فریشتەكانی پێكەوە باس كردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُوا الْعِلْمِ ﴾ ( آل عمران – ١٨)

واتە: "خوا شایەتیی دا كە بێجگە لەو پەرستراوێكی دیكە نیە هەروەها فریشتەكانی، وە ئەوانەش كە ئەهلی زانستن".

دیارە ئەوەش پایەو مەقامێكی زۆر بەرزە بۆ ئەهلی "زانستی شەرعیی" كە خوای كاربەجێ شـایەتیی دانی ئەوانی لەگەڵ شـایەتیی دانی خۆی و فریشتەكانی دا باسكردوە.

٣- خوای زاناو توانا لە ئایەتی "١٢٢"ی سووڕەتی "التوبة"دا مسوڵمانان دەكات بە دوو بەش: یان دەبێ ئەهلی جەنگ و جیهاد بن، یان ئەهلی زانیاری شەرعیی بن، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾، واتە: ئیمانداران بۆیان نیە تێكڕا بڕۆن بۆ جەنگ و جیهاد، دەبوایە لە هەر كۆمەڵێكی زۆری مسوڵمانان دەستەیەكیان بڕۆن بۆ تێگەیشتنی ئایین. (خوای كاربەجێ لێرەدا چوونە جەنگ و جیهادو چوون بۆ وەدەستهێنانی زانیاری شەرعیی،

هەر بە وشەی: (نَفَرَ) هێناوە، یانی: ئینسان چ بڕوات بۆ جەنگ‌و جیهاد- کە جەنگ و جیهاد گەورەترین کردەوەی مسوڵمانانە کە لەکات وجێی خۆیدا بە کۆ مەڵ پێی هەڵدە ستن وەك چۆن نوێژیش گەورەترین عیبادەتە کە مسـوڵمان وەکو تاك پێی هەڵدەستێ!- هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە پرسیاری لێکراوە:(أي الأعمال أفضَل؟!) چ کردوەیەك چاکترە؟! جارێك فەرمووبەتی: (الصّلاة على وقتها) و جارێکیش فەرموویەتی (الجهاد في سبيل الله) وەك لە (صحيح)ی (بخاري)و (مسلم)دا هاتوە، کەواتە: لە فەرزە تایبەتییەکاندا نوێژکردن لە کاتی خۆیدا گەورەترین عیبادەتە، وە لە فەرزە کۆمەڵییەکانیش جەنگ‌و جیهاد لەڕێی خواداو بەرگری کردن لە مسـوڵمانان و خاك‌و کەرامەتیان وکیانی ئیسلامی، گەورەترین عیبادەتە کە بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێ!

جا خوای پەروەردگار دەفەرموێ لە کاتێکدا کە پێویست دەکات مسوڵمانان جەنگ‌و جیهاد بکەن نابێ هەموویان بڕۆن، بەڵکو دەبێ لە هەر کۆمەڵێکێ زۆر دەسـتەیەکیان یاخود کۆمەڵێکی کەمیان بڕۆن بۆ ئەوەی لە دیندا شارەزا بن و زانستی شـەرعیی وەربگرن. ﴿وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی خەڵکەکەیان هۆشیار بکەنەوە کە گەڕانەوە بۆ لایان، بەڵکو ئەوانیش، هۆشیارو بێداربنەوە خۆیان بپارێزن لەو شتانەی کە ناشەرعین و مایەی توڕەیی و سزاو جەزرەبەی خوای دادگەرن کەواتە: خوای بێوێنە بەدوای زانستدا گەڕان و جیهـادکردنی بە

یەکەوە باسکردوەو نەهیشی کردوە کە م سوڵمانان هەموویان بڕۆن بۆ جەنگ و جیهادو هیچیان سەرگەرمی وەرگرتنی زانستی شەرعیی ئەبن، بۆیە لەسەری پێویست کردوون کە لە کاتێ کدا پێویستیش بێ جەنگ و جی هاد ب کرێ، دە بێ هە ندێك لە مسوڵمانان هەر خەریکی پەیداکردنی زانستی شەرعیی بن، چونکە جەنگ و جیهادو هەر کارێکی دیکەی ئیسلامی ئە گەر لەسەر بناغەی عیلم نەبێ نەك هەر بە کەڵك نایەت بەڵکو زۆر جاران خاوەنەکەی زۆریشی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە.

٤- ئینجا خوای بێ وێنەو هاوەڵ، باسی ئەوە دە کات کە ئەهلی ئیمانی بەرزکردۆتەوە بەسەر غەیری خۆیاندا، بەڵام ئەه لی عیلمیشی بە چـەند پلە بەرزکـردۆتەوە بەســەر ئەهلی ئیماندا، وەك دەفەرموێ: ﴿يَرْفَعْ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (المجادلة -١١) ، وا تە: " خوا ئەوانەتان بەرز دەکاتەوە کە ئەهلی ئیمانن -بەسەر بێبڕوایاندا- بەڵام لە ئەهلی ئیمانیش ئەهلی عیلم لە هەموویان بەرزترن بە چەندان پلە"، لێرەدا خوای کاربەجێ دە ستەواژەی (در جات)ی بەکارهێناوە، چونکە هەرکام لەوا نەی کە لە دی نی خوادا شارەزان بە پێی شارەزاییەکەی و بەپێی ئیشکردنی بە زان یاری یەکەی پلەو مەقامێکی دیاری کراوی خۆی هە یە، هەروەها خوای پەنهانبین ئاماژەشی بەوە کردوە کە عیلم ئەگەر کردەوەی پێ نەکرێ بە کەڵکی هیچ نایەت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿والله بما تعملون خبير﴾ واتە: "وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن"یانی

شارەزایە بەوەی کە دەیکەن بەو عیلمەی کە بە دەستتان هێناوە، بۆیە زانیاری شەرعیی دەبێ کارو چالاکی شەرعیی پێ ئەنجام بدرێ ئەگەرنا خاوەنەکەی لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

٥- فەرموودەی پێغەمبەریش "علیه الصلاة والسلام" لەوبارەوە زۆرن.

یەکێك لەوانە ئەو فەرموودەیەیە کە "بخاري" لە "معاویة"وە هێناویەتی -خوا لێیان ڕازی بێ- کە دەفەرموێ: ﴿مَنْ یرِد الله به خَیراً یفقّهة في الدّین﴾ واتە:"هەر کەسێك خوا بیەوێ خێرو چاکەی بێنێتە ڕێ لە دین دا شارەزای دەکات"، وە لە دیوانەکەی "طبراني"دا ئەوەشی بۆ زیاد کردوە: (ویَلْهِمْهُ رُشْدَهُ) یانی"وە سەر ڕاستیشی دەکات" چونکە (الهام) بریتیە لەوەی کە خوای پەروەردگار وەك خور پەو فێرکردنێکی دەروونی و تایبەت، زانستی بخاتە دەروونی ئینسانەوە، "رشد"یش بریتییە لە سەر ڕاستیی کەواتە: شارەزایی لە دیندا مایەی سەرەوخێری ئینسانە، وە لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) ئەوەش وەردەگیرێ کە زانستی شەرعیی خەڵات و بەخششێکە لە خواوە!

کەواتە: برایانی قوتابی و فەقێ! کاتێك کە ئێمە خەریکی پەیداکردنی زانستیی شەرعیی دەبین دەبێ زۆر دڵمان بە خۆمان خۆش بێ کە دیارە خوا ئێمەی خۆش دەوێ بەوەی کە دەستی گرتووین وە دڵی وەرچەرخاندووین بەرەو شارەزایی لە دیندا!

٦- لە فەرمایشتێکی دیکەشدا کە (بخاریو مسلم) لە "أبو هریره"وە دەیگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ چ لە سەردەمی نەفامی چ

لە سەردەمی ئیسلامدا خێرو چاکەی هەموو بە ستۆتەوە بە تێگەیشتن و شارەزاییەوە وەك دەفەرموێ: ((تَجِدون الناس مَعادِنَ فخيارهم في الجاهلية، خ يارهم في الأ سلام اذا فَقه ـوا)). لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: ((تجِدونَ النـــاس معادن كَمَ عادِنِ الذّهب والفضّةِ فخ يارهم في الجاهل ية خ يارهم في الا سلام اذا فَقهوا)) واتە: "خەڵك دەبینن وەك کانزایەکان (کانزای زێڕو زیو) وان بەڵام ئەوانەیان کە لە سەردەمی نەفامییدا چاك بوون، دوای ئەوەی کە دێنە نێو ئی سلامەوەو شارەزا دە بن، دی سان ئەو چاکێتـی یەیان دەپارێـزن ".

لێرەدا پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئاماژە بۆ شتێکی زۆر قووڵ دەکات ئەویش ئەوەیە کە ئینسان وەك خودی ئیـ سان- هەندێك چاکە"فضيلة"ی بنەڕەتی هەن، جا ئەو مرۆڤە مسوڵمان بێ یان کافر، بۆ وێ نە: سەخاوەت، دڵ گەورەیی، عەقڵو ووردبوونەوە، ئارامیوهێمنی، ئازایەتی، لێزانیوکارامەیی..هتد.

جا پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئاماژە بەوە دەکات کە دەبێ ئەو سیفەتە چاکە ئەساسیو بنەڕەتییانە لە مرۆڤ دا هەبن ئینجا بەهۆی ئیمانو زانستی شەرعیی یەوە بەرز دەبێ تەوەو دەبێتە ئینسانی چاك! لێـــرەدا مەبەستم ئەوەیە کە: "جاری وا هەیە کەسێك بناغەکەی تەواو نیەو مەعدەنەکەی باش نیە، جا هەرچەندە زانستی شەرعیی وەدەست دێنێ و دەچێ تـە بەرگی زانایانیشەوە، بەڵام بناغەی کەسایەتییو مەعدەنە کەی تەواو نیە، بۆ وێنە: کابرایەکی ماستاوکەرە (مُتملّق)، یان ئینسانێکی

نەفس نزم و پوولەکییە، یان ئینسانێکی ترسەنۆکە یاخود ڕژدو چرووکە، بۆیە هەرچەندە زانا بێ هەر نابێ ـبە ـهیچ!، کەوا ـتە ئێمە دەبێ ئاگامان لەو سیفەتە بنەڕەتی و ئەساسییانە ـبێ ـکە بێگومان بە هۆی ئیمانەوە زیاتر لە ئینساندا ڕۆدەچن و گە ـشە دەکەن، کەواتە: مەرج نیە ـهەر کە سێك زانـیاری ـشەرعیی وەدەست هێنا، تەنیا بەوەندە چاك بێت و ـبەرز بێـ ـتەوە، ـبەڵکو کۆمەڵێك سیفەتی چاکی ئەساسی و بـنەڕەتی ـهەن ـکە ـلە ئینسانی کافردا بن یان لە ئینسانی مـ ـسوڵماندا ـهەر ـچاکن، بۆیە پێویستە ئینسان ئەو خەسڵەتە بەرزانە وەدە ـست بێـ ـنێ و لەگەڵ ئەو سیفەتانەی دیکە کە لە وەحی یەوە سەرچاوە دە ـگرن ئاوێتەیان بکات ئەوجار دەبێتە ئەو ئیـنـ ـسانەی ـکە شایـ ـستەی ئەوەبێ ـپێی بـ ـگوترێ: پێـ ـشەواو ـئەهلی ـعیلم، وە ببێـ ـتە ڕێنیشاندەری مسوڵمانان.

٧- هەروەها پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمایـ ـشتێکی دیکەیدا ڕاستەوخۆ ئاماژە بە (فەقێ)یان دەکات وەك دەفەرموێ: ((لا يَزال اللّه تعالى يغرِسُ في هذا الدّين غرْساً يـ ـستعملهم(فيه) بطاعته)) رواه أحمد و ابن حبّان. واتە: "خوای بەرز بەردەوام لەم دینەدا هەندێك نەمام دەنێژێ کە لە فەرمانـ ـبەریی خۆ ـیدا ـبەکاریان دەهێنێ" کە بە تەئکید لێرەدا پێش هەموو کەس مەبەستی ئەو فەقێو قوتابی یانەیە، کە بەدوای زانیاری شەرعیی دەکەون، وەبە پێگەیشتنێکی ئیماندارانەو زانستییانە دێنە نێو مسوڵمانەتی و

دینداریی‌یەوەو بە بەرچاو ڕوونی یەوە دینداریی دە کەن، وە دوا یی دەتوانن ببنە چاوساغ و سەرمەشق بۆ خەڵکیش.

٨- لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر(علیه ال صلاة وال سلام) بۆمان باسی دەوری گرنگ ـــی زانا یان دە کات وە با سی ئەو کەلێنەشمان بۆ دەکات کە بە هۆی نەبوونی زانایا نەوە لە نـ یو مسوڵمانانندا پەیدا دەبێ وەك دەفەرموێ: ((اِنَّ الله تعالی لایَقبِض العلمَ انتزاعاً یَنتزعه من العباد ولکنْ یَقبِض العلمَ بقبِض العلماءِ حتی إذا لَمْ یُبْقِ عالماً اتّخَذَ النّاس رؤوساً جهّالاً فَسئِلوا فأفتوا بغیر علمٍ فَضَلّوا وأضلّوا))رواه البخاري و مسلم عن عبدالله بن عـمر رضي الله عنهما، واتە: (بێگومان خوای بەرز زانیاری دانارِنێ بە دارِنین لە بەندەکانی وەربگرێتەوە، (وە لە عەقڵ و دڵ یان دەری بێ نێ) بەڵکو خوا زانیاری - شەرعیی  لەسەر زەوی ناهێڵێتەوەو وەری دەگرێتەوە بە هۆی کۆچ و وەفاتی زانایان، هەتا کاتێك کە هیچ زانای نەهێشتن، خەڵك کەسانێکی نەفام و نەزان دە کات بە براگەورەو بەرپرس‌و پرسیاریان لـێ‌دەکرێ (دەربارەی دین‌و ژیـن) ئەوانیش بەبێ زانیاری‌و شارەزایی فەتوایان بۆ دەدەن و سەرەنجام بۆ خۆشیان سەرگەردان دەبن‌و خەڵکیش سەرگەردان دەکەن). جا ئێستا ئێمە ئەوە وەك واقع دەبینین: بە داخەوە ڕژێمە عەلمانیەکان لە ئەنجامی ئەوەدا ڕێرەوەکەیان پێچەوانەی ئیسـلامەو لە گەڵ قورئان‌و سوننەتدا ناگونجـێ، ئەهلی عیلمی ڕەسەن و ڕاستەقینە لێیان کۆنابنەوەو ناتوانن زانایانی ڕەسەن و چاك لە خۆیان نز یك بخەنەوە، بە ناچاری پەنا دەبەنە بەر هەندێك کەس، کە لە بەرگی

زانیاری شەرعیی دانو لە بەرگی زانایان دان، بەڵام لەڕاستیدا یان لە دین و ژیندا نەشارەزان، یاخود ئەوەندەش کە دە یزانن کاری پێناکــەن، یاخود مل بە ئایەتو حەدیسوحوکمە شەرعییەکان دەسووڕێنن، تاکو لەگــەڵ هەواو ئارەزووی طاغووت و ڕژێ مە نائیسلامیەکاندا بیانگونجێنن، ئیدی سەرەنجام سەر لە خۆشیان و لە خەڵکی دیکەش دەشـێوێنن، بەڵێ ئەوە واقیعێکە ئێ ستاکە دەیبینین، کە لە ڕا ستیدا گەورەترین نەخۆ شیو دەردە، کە مسوڵمانان تووشی بوون!

٩- لە فەرمایـ شتێکی دیـ کەدا کە"تر مذی وا بن ما جة" لە "أبوهریرة"وە (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگێڕ نەوە پێغەمـ بەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان الدّنیا ملعونة، ملعون ما فیها الاّ ذکر الله وما والاهُ وعالماً أو متعلماً)) وا تە: "بێگو مان دونـ یـا خۆیـ شیو هەرچی تێشیدایە نەفرین لـێکراوە لە لایەن خواوە، جگــە لە یادی خواو هەر شتێك، کە پەیوەندی بە یادی خواوە هە یە، وە جگە لە زانایەك کە لە دینی خوادا شارەزایە یاخود کەسێك کە دەیەوێ زانیـاری وەدەست بێنێ و شارەزا بێ".

هەروەها هەر لەوبارەوە پێغەمبــەری خوا (علیه أفضل الصــلاة والسلام) لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ((کن عا لماً أو متعلّماً ولا تکن الثالث فتَهلكَ))، واتە: " یان زا نا بە یان فێرخواز بە-هەوڵ بدە زانیاری وەربگری- وە سێهەمیان مە بە ئەگەرنا بە هیلاك دەچیت" دیارە سێیەمیان ئەوە کە ئێنـ سان

خۆی شارەزا نەبێ‌و نەزانێ‌و هەوڵیش نەدات کە زانیاری وەدەست بێنێ‌و هەر لەو نەزانیيەی خۆیدا بمێنێتەوە.

١٠- فەرمایشتێکی دی کەی پێغەمبەری خوا(علیه الصلاة والسلام) هەر لەوبارەوە کە مەدحێکی گەورەی قوتابیانی زانستی شەرعیی تێدایە ئەوەیە کە دەفەرموێ[1]: ((انّ الملائکة لتَضَعُ أجنحَتها لطالب العِلْم رضیً بما یَطلُبُ))، واتە: ((بێگومان فریشتەکان باڵی خۆیان ڕادەخەن بۆ کەسێك کە بە دوای زانستی شەرعیدا دەگەڕێ، وەك ڕێزو ڕەزامەندیی بۆ کارەکەی))، ئیمام نـــەوەوی (ڕەحمەتی خوای لـێ‌بێ) بە بۆنەی ئەم فەرمایشتەوە لە زانایەك دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێـــك قوتابی بووین لە بەسرەدە چووین بۆ لای مامۆستایەك کە زانسـتی شـەرعیی لـێ‌وەربگرین، یەکێکمان لەگەڵدابوو بابایەکی فاسق‌و بێ‌بەندو بار بوو، گاڵتەی بە دین‌و شەرع دەهات‌و پێمان پێ‌دەکەنی، گوتمان: بۆ چی پێمان پێ‌دەکەنی؟! گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ پەرۆشی ئەو مەلائیکەتانەمە کەوا بە خێرایی پێ لە باڵیان دەنێین! جا ئێمە ڕۆیشتین و ئەومان بەجێ‌هێشت، لێمان پرسی بۆ نایەی؟! بەڵام لە شوێنی خۆیدا چەقی بوو! کە گەڕاینەوە لای هەردوو پێ‌ی شەلەل بوو بوون!! دیارە لێرەدا کە دەفەرموێ: فریشتەکان باڵی خۆیان ڕادەخەن، مەرج نیە بەو شێوەیە باڵی خۆیان ڕابخەن

(1) رواه أحمد و أبوداود و ابن حیّان والحاکم و رَمَزَ السیوطي لحُسْنِه.

تاكو فەقێو قوتابی بەسەریاندا بڕۆن! بەڵكو، لێرەدا مەبەستی ئەوەیە كە فریشتە ڕێزدەگرن لە فەقێو قوتابی زانستی شەرعیی مادام سەرگەرمی ئەوەبێ كە لە دینی خوا شارەزا بێ بۆ ئەوەی بەو شارەزاییەی دوایی خەڵكی دیكەش شارەزا بكاتو ئەركی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لە نێو ئوممەتەكەیدا جێبەجێ بكات، جا لەبەر ئەوەی كە فریشتەكان هاوەڵ و هاودەمی ئەهلی ئیمانن، بۆیە بە طاعەتیان دڵخۆش دەبن وەك چۆن بە خراپەو سەرپێچیشیان نارەحەت دەبن وتووڕە دەبن .

١١- كۆتایی ئەم بابەتەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دێنین كە تێیدا دەفەرموێ: ((فَضل العالِم عَلى العابِدِ كَفَضْلي على أدناكم انّ اللّه عزّو جل وَملائكته وأهل السّموات والارضين حتَّى النَّملة في جُحرِها و حتى الحوتَ في البحر لَيصَلّون على معلِّم النّاسِ الخَير)) (رواه الترمذي)، واتە: (پایە بەرزیی زانا بە سەر خوا پەرستێكی ئاساییدا وەك پایەو مەقامی من وایە لە چاو بچووكترینتان، بێگومان خوای پایە بەرزو فریشتەكانی، وە خەڵكی ئاسمانەكان و زەوییەكان تەنانەت مێروو لەش لە كونە مێرووی خۆیداو نەهەنگ لە دەریادا دووعا دەكەن بۆ كەسێك كە چاكە فێری خەڵك دەكات).

دیارە ئەو فەرمایشتوئایەتانە تەنیا نموونەیەك بوون لەو ئایەتو فەرموودانەی، كە باسی ئەهلی عیلم و داواكەرانی زانیاری شەرعیی دەكەن، وە لەراستیدا زانایانیش هەردەبێ(طالب العلم)بن، چونكە

زانایان کامەیان لە هەموویان شارەزاتر دا نراوە بە پێ شەواو سەرمەزەبەکانیشەوە، هەتا کاتی سەرەمەرگیشیان هەر خەریکی وەدەستهێنانی زانیاری بوون، هەتا هەیانە لە سەرەمەرگیشدا پێش گیان دەرچوونی پرسیاری کردوە: ئەرێ لە بارەی فلاَن مەسەلەوە کێ زانیاری و شارەزاییەکی هەیە؟! جاکە لە وەڵامیدا پێیان گوتوە: تۆ خەریکی گیان دەسپێری و لە ( سَـكَرات ا لموت) دای؟! ئەویش گوتوویەتی: ڕاســتە بەڵام حەزناکەم لەو مەســەلەیە ناشارەزا بــم لە کاتێکدا کە گیانەکەم تەسلیمی خوای پەروەردگار دەکەمەوە!

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە دەبێ هەمووومان هەر خەریکی وەدەستهێنانی زانیاری بین هەتاکو کاتی مردن، وەك گوتراوە: ((أُطْلُبِ العِلْــــمَ من المَهْدِ الـى اللَّحْد)) "لەسەر لانکەوە هەتا نێو گۆڕ هەرداوای زانیاری بکەو هەوڵی پەیداکردنی بدە".

## تەوەرەی ســێیەم : کەسایەتی قوتابی زانیاری شــەرعیی

برایانی قوتابی و فەقێی خۆشەویست !

ئەو مەدح‌و ستایش و پایەبەرزیی‌و حورمەت‌و ڕێزە کە باسکرا لە ڕاستیدا بۆ هەموو کەس نیە، چونکە مەرج نیە هەر کە سێك کە ناوی لەخۆی نا فەقێ، یان مەلا، ئەهلی عیلم بێ، نەخێر ئەوە وا نیە! بەڵکو ژمارەیەك سیفەت و خووڕەو شتی تایبەتی هەن کە پێویستە ئەهلی عیلم ئەو سیفەتانە لە خۆیان دا ببیننە دی ئنجا شایستەی ئەو هەموو مەدح‌و سەناو پلەو پایە بەرزە کە خوا (عزّوجل)و پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) باسیان کردوە، دەبن، جا من لێرەدا دە سیفەتم ڕیز کردوون، بێگومان سیفەتی زیاتریش هەن بەڵام من ئەو دە سیفەتەم تێدا هەڵبژاردوون:

### یەکـەم: ئیمـان و عەقیدەی ڕاسـت و پـاك:

یەکەمین شتێك کە فەقێ‌و قوتابی زانیاری شەرعیی دەبێ خاوەنی بێ، ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست‌و ساغ‌و پاك‌و پوخت‌و تەواوە، یانی: دەبێ خوا بە یەکگرو خواپەرسـت بێ‌و دووربێ لە شیرك و نیفاق، وە شوێنکەوتووێکی ڕاستەقینەی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) بێ،

وە پابەندێکی ڕەسەن بێ بە دینی خوای پەروەردگارەوە، چونکە بیروباوەڕ- عقیدە-ی ئیسلامی لە سێ پایەی سەرەکیدا کۆدەبێتەوە:
١- خوا بە تاکە پەروەردگار زانین و پێ ڕازی بوونی.
٢- محمّــد ﷺ بە ڕەوانەکراو و نێراوی خوا زانین و پێ‌ڕازی بوونی.
٣- ئیسلام بە بەرنامەی ژیان زانین و پێ‌ڕازی بوونی.

وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمایشتێکیدا کە "مسلم" لێی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((ذاقَ طَعمَ الأيمان مَنْ رَضيَ بالله رباً و بالأسلامِ ديناً و بمحمـدٍ ﷺ و رسولاً)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەشدا کە بوخـــاری و موســلیم گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دە فەرموێ هەر کەسێ لە ئێوە کە گوێی لە بانگ بوو با بڵێ: ((وأنا أ شهَد أن لا اله الاالله وأنّ محمّـداً رسول الله رَضيت بالله ربّاً و بالا سلامِ دي ناً و بمحمـّدٍ ﷺ نبيّاً و ر سولاً)) ئەوە یانی چی؟! ڕازی بوون بە پەروەردگاریتی خوا، یانی تۆ جگە لە خوا هیچ کەسێکی دیکە بە خاوەنی خۆت نازانی، بۆیە بێجگە لە خواش کەس بە پەر ستراوی خۆت نازانی، وە ڕازی بوون بە بەرنامەییتی ئیســـــلام یانی تۆ تاکە بەرنا مەو ڕێباز ێك کە لە ژ یانی شەخ صیی و خێزان یی و کۆمەڵایەتیتدا پەیڕەویی لێ‌دەکەی، بریت یە لە ئی سلام، وە ڕازی بوون بە پێغەمبەرایەتی و ڕەوانەکراوێتیی (محمّـد المصطفى) (عل یه الصلاة والسلام) ڕێگە نادات بە ئینسان کە دوای هیچ برا گەورەو پێشەوایەك بکەوێ مەگەر ئیجازەی لە پێغەمبەرەوە پێ‌بێ، لەوبارەوە

خوای کاربەجێ لە ئایەتی(59)ی سوورەتی (النّساء)دا دەفەرموێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ.﴾، واتە: "ئەی ئەوانەی ئیمانتـــــان هێناوە فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، وە هی کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن" واتە: حوکمڕان و کاربەدەستانێك کە مسوڵمانن و پابەندن بە قورئان و سوننەتەوەو خۆشتان کردووتانن بە براگەورەی خۆتان، بێگومان کەسێکیش دەگونجێ بکرێتـە برا گەورەو قسە بەدەستی مسوڵمانان، کە بە ڕاستی میراتگری پێغەمبەر ﷺ بێ وە پابەندبێ بە ڕێبازو بەرنامەیەکەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناویەتی.

کەواتە: پێش هەموو شتێك دەبێ قوتابی زانستی شەرعیی خاوەنی ئیمانو عەقیدەیەکی ڕێكو ڕاستو دامەزراو بێ کە لەو سێ ئەسڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- جگە لە خوا کەسی دی بە پەروەردگارو پەرستراوی خۆی دانەنێ.
٢- ئیسلام بەرنامەی ژیانی بێت.
٣- وە پێغەمبەریش ﷺ بە ڕەوانەکراوی خوا بزانێ.

## دووەم: نیـاز و مەبەسـتی پـاك و بـەرز:

قوتابی زانستی شەرعیی لە وەرگرتنی زانستەکەیدا دەبێ نیازی پاك بێ و ئامانجی بەرز بێ، نیازی پاك بێ یانی مەبەستی ئەوە نەبێ ئەو زانیارییە شەرعییە بۆیە وەردەگرێ تاکو سبەینێ ببێتە مەلایەكو خەڵك ڕێزی لـێدەنێتو لە پای ئەوەدا نانو ژیانێکی باشی دەست

بکەوێ! نەء، نابێ ئەو نیازەی لە دڵدابێ، بەڵکو دەبێ نیازی وا بێ کە ئەو زانیارییە میراتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)و خوای پەروەردگار بۆ ئەویشی ئاسان کردوە تاکو فێری بێ وە بۆ خۆشی کاری پێبکاتو بە مسوڵمانانیشی ڕابگەیەنێو ئەوانیش کاری پێبکـەن، وە سەرئەنجام ئەو میللـەتو خەڵکە بەو شـێوەیە بژیەن کە خوای بەرزو مەزن دەیەوێ، ئائـەوە دەبێ هاندەری قوتابی زانستی شەرعیی بێ، بۆ وەرگرتنـی زانیارییەکەی وە مەبەستیشی خوا لەخۆ ڕازیکـردن بێ نەك وەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییەکی دونیایی.

برایـــانی قوتابی و فەقێ!

من بە تەجروبەی ژیانی خۆم بۆم دەرکەوتوە کە ئەگەر ئینسان دڵی خۆی لە هەر کارێکدا بۆ پەروەردگاری ساغ کردەوە، ئەوە خوای پەروەردگاریش ئەو کارەی بۆ ئاسان دەکات و بەرەکەتیشی بۆ تێدەخات وە بە تەئکید پاداشتی لە قیامەتێ مسۆگەرە، بەڵام هەرکاتێك نیازەکەی خڵتەی ڕەگەڵ کەوت کارەکەی بۆ دونیایەو بەرەکەتی نابێ، وە بەتەئکید لە دوارۆژیشدا پاداشتی نابێ، وەك خوای زاناو شارەزا لە ئایەتی (5)ی سوورەتی (البیّنة) دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾، واتە: "وە فەرمانیان پێنەکراوە بەوە نەبێ کە خوا بپەرستن وە گەردن کەچیی و بەندایەتی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوە -خڵتەی پێوە نەمێنێ- وە نوێژ بەرپا بکەنو زەکات بدەن ئا ئەوەشە دینی میللەتێك کە ڕێیەکی ڕاستیان گرتوە"،

هەروەها پێغەمبـەریش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((إنّ ما الأعمال بالنّيّات وإنّما لكلّ إمرئٍ ما نوى..)) (رواه البخاري وم سلم عن عمر بن الخطاب  رضي الله عنه-)، واتە: بێگومان کردەوەکان  کردەوەی چاك- پاداشتیان بە گوێرەی نیەتە.

## سـێیەم: خواپەرستیی تێرو تـەواو:

ئەهلی عیلم دەبێ ئەهلی عیبادەت بن، ئ ێوە هەمووتان بەو شێوەیەن -انشاءالله- بەڵام هەر بیرتان دەخەمەوە چونکە من هەندێك ژیـانی فەقێیایەتیشم بینیوە هەرچەندە بە ڕەسمی فەقێ نەبووم، بەڵام بەینێکی لەناو فەقێیان ژیاوم، عادەت وابوو لەناو فەقێیاندا[5] کە لە عیبادەت زۆر تەمبەڵ بوون! جارێ شەونوێژیان هەر نەبوو وە نوێژی بەیانیانیشیان بەدەگمـەن دەکرد یان کاتێك دەیانکرد نیزیکی ڕۆژهەڵاتن بوو!! جا دەیانگوت: فلان کەس! فەقێو نوێژی بەیانیان نەگوتوە! دیارە شەونوێژو ڕۆژووی پێنج شەم و دوو شەم و نو ێژی چێشتەنگاو ... هیچیان نەدەکردن ڕۆژێکیان لەگەڵیا ندا دانی شتم گوتم: برایان باشە ئێمە ئەو عیلم و زانستە شەرعیانە بۆ دەخوێنین؟! گوتیان: بۆ ئەوەی ببینە مەلا! گوتم: کاکە، ئێمە بۆ ئەوە ئەو زانستە دەخوێنین تاکو فێری بین پاشان کاری پێ ب کەینو دوا یی ف ێری خەڵکیشی بکەینو خەڵکیش ئیشی پێ بکات، ئەسڵەکە ئەوەیە، جا ئەگەر ئێمە لە خودی خۆمان دا کاری پێ نەکەین بەکەڵك نا یەت،

(5) دیارە ئەوە لە سەرەتای هەشتایەکان بوو وە لە دێهاتی کوردستانی ئێران! بۆ ئەوەی حوکمەکە بەسەر هەموو فەقێیان دا نەدەم.

جا ئەگەر تێبینیتان کردبێ برایان! زانیارییەك کە ئیشی پێنە کەی لە بیرت دەچێتەوە، لەو بارەوە ئەم بە سەرهاتەی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە: جارێکیان من لە ماڵی خۆمان نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەم دەکرد، جا من عادەتم وایە هەندێك جار سوورەتی (ألـم)ی سەجدەو سوورەتی (الإنسان) دەخوێنم، چونکە وا سوننەتە، جا کاتێك لە سەجدەی تیلاوەی سوورەتی (ألـم)دا چوومە سەجدە - کۆمەڵێك مامۆستا (مەلا)و خەڵکی دیکەشم میوان بوو- هەستم کرد کۆمەڵێکیان هەر بە پێوە مابوون و هەندێکێ شیان هاتنە سەجدەو هەندێکی دیکەشیان چوونە ڕکووع، دوای تەواوبوونی نوێژ یەکیان گوتی: ئەرێ مامۆستا ئەو نوێژە سێ ڕکات نەبوو؟!! گوتم نەخێر مامۆستا دوو ڕکات بوو، بۆچی؟! گوتی: وەڵڵا ئێمە هەر سەرمان لـێ تێکچوو بووینە سێ بەش، باشە مامۆستا ئەوە چی بوو؟!! گوتم: ئەوە سەجدەی قورئان خوێندن (تلاوة) بوو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: کە لە نوێژی بەیانیانی ڕۆژی جومعە لە ڕکاتی یەکەمدا (ألـم)ی سەجدە بخوێنرێ، گوتی: وەڵڵا من لەبیرم نەمابوو ڕاست دەفەرمووی، بەڵام لە نوێژەکەدا هەندێکیان لەگەڵ تۆ هاتنە سەجدەو هەندێکی دیکەش بە پێوە مابوونەوەو ئەمنیش گوتم :"خیر الأمورِ أوسطها" بۆیە منیش چوومە ڕکووع!!

بەڵێ برایانی فەقێ!لەڕاستیدا دەبێ ئەهلی عیلم ئەهلی عیبادەت بن، ئێمە لە کاتێکدا کە باسی شەونوێژ دەخوێنین دەبێ شەونوێژ بکەین هەروەها کە باسی ڕۆژووی سوننەت دە خوێنین، دەبێ ڕۆژوو

سوننەتەکان بگرین بە پێی توانا، هەروەها باسی قورئان خوێندن، زیکر، نوێژی چێشتەنگاو و زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و ... هتد.

وە برایانی خۆشـــەویست! لێتان وەسیەت بێ، بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان عابید دەبێ بۆ خوا زانیارییەکەشی بەرەکەتی دەبێ وە خەڵك لێی بەهرەمەند دەبێ !

## چــوارەم : خــۆ تەزکیــەکــردن:

سیفەتێکی دیکەی قوتابیانی زانستی شەرعیی ئەوەیە کە هەمیشە لەگەڵ نەفسی خۆیاندا خەریکبن و خۆیان تەزکیە بکەن، وە خۆیان بە تەقوا بڕازیننەوە. تەقواش بریتیە لەوەی کە هەرچی خوا پێی ناخۆشـــە خۆی لــێ دووربگرن، ئنجا ئایا خوای (عزّوجل) چی پێناخۆشـــە؟! خوا پێی ناخۆشە قەدەغەکانی بشـــکێنی و توخنی حەرامکراوەکان بکەوی، یاخود ئەو شـــتانەی کە خوا فەرزی کردوون نەیانکەی و بیانچوێنی، کەواتە تەقوا ئەوەیە کە تۆ پابەندبی بە شەریعەتەوەو هەرچی شەرع نەهی لــێکردوە نەی کەی و هەر چی شەرع پێویستی کردوە بە پێی توانــا بیکەی.

شایانی باسیشە کە پارێزکاریی (تقوی) بە ئەندازەی تەزکیــەبوونی نەفس لە مرۆڤــدا پەیدا دەبێ، وەك خوا فەرمویەتی: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَـا وَتَقْوَاهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ۞ وَقَدْ خَـابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾ (الشمس/ ٧ - ١٠)، بەڵێ پارێزکاریی تەنها لە دڵ و دەروونێکدا جێگیر دەبێ و وەك پێویستە سەقامگیر دەبێ کە پاکسازیی‌و چاکسازیی تێدا ئەنجام درابێ‌و لە خووو خەســڵەتە نزم‌و

پەستەکان(الرذائل) بژارکرابێ‌و بە ئاکارو سیفەتە بەرزو پەسندەکان (الفضائل) ڕازێنرابێتەوە، بە زاراوی ئەهلی عیرفان (تخلیة و تحلیة) کرابێ، بە کورتی: تەقوا میوانێکی بەڕێزەو ناچێتە هەموو ماڵێك و بە هەموو دڵ و دەروونێك ڕازی نیە!

## پێنجـەم : ڕەوشــتی بــەرزو جوان :

خەسڵەتێکی دیکەی پێویست بۆ ئەهلی عیلم بریتیە لە ڕەوشتی بەرزو جوان، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) زۆر باسی ڕەو شتی بەرزو جوانی کردوە، بۆ وێنە لە یەکێك لە فەرمایشتەکانیدا دەفەرمویێ: ((انّ مِن خیارکمْ أحاسنکم أخلاقاً)) (رواه البخاري ومسلم)، واتە: بێگومان لە چاکترینتان ئەوانەن کە ڕەوشتیان بەرزو جوانترە.

وە لە فەرمایشتێکی دیکەیدا دە فەرمویێ: ((أفضَلَ المؤمنین أحسنهم خلقاً)) (رواه ابن ماجه والحاکم عن ابن عمر رضي الله عنهما) واتە: چاکترینی ئیمانداران ئەوانەیانن کە ڕەوشتیان چاکترو جوانترە.

دیارە مەبەستیش لە ڕەوشتی بەرزو جوان هەر شتێك و دوو شت نیە، بەڵکو ئینسانی مسوڵمان دەبێ لە زاتی خۆیدا خۆی بە هەموو ڕەوشتێکی بەرزو جوان بڕازێنێتەوە. بۆ وێنە: نابێ ئەهلی عیلم وشەو تەعبیری ناشیرین و بێ‌نەزاکەتیان بەدەم دابێ، بە ڕاستیی من سەرم سووڕ دەمێنێ کە هەندێك جاران گوێم لە هەندێك لە مامۆستایانی سەر مینبەر دەبێ کە وشەو تەعبیری وا دەڵێن کە زیاتر هی خەڵکی بازارە! بەڵێ ئەهلی عیلم دەبێ وشەو تەعبیریان زۆر جوان بێ‌و نابێ ووشەی ناشیرین بەکاربێنن، هەروەها دەبێ

سیماشیان پاكو ڕێكو جوان بێ، وە دەبێ خۆ بە كەمگرو خاكی بن لە ڕەفتارو هەڵسوكەوتدا، وە لەگەڵ مامۆستادا دەبێ ئەوپەڕی ڕێز پێشان بدەن وە لەگەڵ ڕەفیقە قوتابییەكانیاندا بە هەرچی سیفەتی بەرزو جوانە مامەڵە بكەن.

هەروەها بەهەمان شێوە لەگەڵ دەرودراو سێو ماڵو میوانو دۆستو دوژمن و... لەگەڵ هەموو كەسدا، دەبێ ئەهلی عیلم ڕازێنراوە بن بە ڕەو شتی بەرزو جوان، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((أكمل المؤمنين ايماناً أحسنهم خُلقاً)) (رواه الترمذي بأسناد صحيح عن أبي هريرة)، واتە: ئیمان تەواوترین مسوڵمانان ئەوانەیانن كە ڕەوشتیان بەرزو جوانتـر بێت.

وە بە تەئكید ئینسانیش ناتوانێ ڕەوشتی بەرزوجوانی هەبێ تاكو ئیمان و تەقوایەكی باشی نەبێوخۆی تەزكیە نەكردبێ، هەر بۆیەشە خوا (جلّ شأنه) مەدحی پێغەمبەری پێ شەوامان ﷺ دەكات بە ﴿وإنّكَ لعلى خُلُق عظيم﴾ كە بە تەئكید پێغەمبەر هەموو شتێكی مەزن (عظیم)ی هەبووە، بەڵام مەدحی دەكات بە خووڕەوشتی مەزنو بەرزو گەورە، چونكە ئەویش بەرهـەمی ئیمان و عیبادەتو تەقواو عیلمێكی گەورەیە!

## شـەشـەم: كـات بە فـیـڕۆ نـەدان:

سیفەتێكی دیكەی ئەهلی عیلمو فەقێیانی زانستە شەرعییەكان ئەوەیە كە نابێ كاتی خۆیان بە فیڕۆ بدەن، چونكە خوای پەروەردگار لە سەرەتای سووڕەتی"المؤمنون"دا ئاوا مەدحی ئیمانداران دەكات:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (1) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (2) وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ مەدحیان دەکات بەوەی کە پشت لە "لَغـو" دەکەن "لَغـو"ش بریتیە لە هەر شتێکی پووچ، هەر شتێك کە سوودبەخش نەبێ، جا قوتابیانی زانستە شەرعییەکان دەبێ خۆ لە "لَغـو"ش بپارێزن نەك هەر لە حەرام، وە هەر کەسێك ڕژد نەبێ لە سەرفکردنی کاتی خۆیدا زانیاری بۆ وەدەست نایەت، بەڵێ دەبێ لە سەرفکردنی کاتی خۆتدا زۆر چرووك بی و نابێ کاتەکانت بە سەخاوەتەوە سەرف بکەی. ئەگەر بتەوێ لە بواری وەدەست هێنانی زانستدا شتێك بە شتێك بکەی، زانایانیش جوانیان گوتوە: ((العلمُ لايُعطيك بَعضَه حتى تعطيَهُ كُلَّك!)). واتە: زانیاری هەندێکت ناداتی تاکو خۆتی بۆ تەرخان نەکەی!

## حەوتەم: بەردەوام بوون لەسەر فێر بوون و بە کەم قەناعەت نەکردن:

سیفەتێکی دیکە ئەوەیە کە قوتابی زانستی شەرعیی دەبێ هەوڵ بدات هەرچی زیاتر شارەزا بێ وە بە زانیاری کەم قایل نەبێ، سەرنج بدەن چۆن خوای زانا (عزّوجل) بە پێغەمبەری خۆی فەرمووە کە بەردەوام داوای لێبکات کە زانیاری بۆ زیاد بکات: ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾( طه -١١٤)، بۆیە ئێوەش نابێ بە بەرنامە(منهج)ی خوێندنەکەتان واز بێنن، بەڵکو دەبێ بەردەوام موتالا بکەن و قورئان لەبەر بکەن، فەرمایشتی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە بەر بکەن هیچ کاتێکیش واز لە وەرگرتنی زانست نەهێنن و پێتان وابێ کاتێك کە ئیجازەتان وەرگرت یاخود کۆلێژتان تەواوکرد یان فلان

قۆناغەتان بڕی، تازە ئەوە پێویستیتان بە وەرگرتنی زانست نەماوە!! چونکە بە ڕاستی ئینسان هەتا زیاتر بە زانستدا قووڵبێتەوە زیاتر نەزانیی خۆی بۆ دەردەکەوێ، وە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە چەندە ئاتاجی شارەزابوون و فێربوونی زیاترە.

**هەشتەم: گەڕان بە دوای مامۆستای زاناو تواناد‌ا:**

قوتابی زانستی شەرعیی دەبێ بە دوای ئەو زانایانەدا بگەڕێ کە بە ڕاستی بە کەڵك دینی زانستیان لێ وەربگیرێ وەك زانایان فەرموویانە: ((إنَّ هذا العلمَ دينٌ فانْظروا ممَّن تأخذون دينكمْ!))، واتە: "بێگومان ئەم زانستە -شەرعییە- دینە، جا چاك سەرنج بدەن داخۆ دینەکەتان لە کێ وەردەگرن!".

بەڵێ بەڕێزان !

مامۆستایەك کە لە بنەڕەتدا تووشی لادان (انحراف)و خلیسکان بووە و وەك پووش بەدەم ڕەشەبای فیکرەیەکی پووچەوە چووە، ئەوە بە کەڵکی ئێوە نایەت ئاخر کەسێك بە کەڵکی خۆی نەهاتبێ چۆن دادی تۆ دەدات؟! بۆیە دەبێ لە دەوری ئەو مامۆستایانە کۆبنەوە کە بە کردەوە میراتگری پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)ن تاکو ئیستیفادەیان لێ بکەن، چونکە قوتابی کە زانستی شەرعیی دەخوێنێ نابێ هەرئەوەندە بێ کە مێشکی پڕ بکات لە زانیاری، بەڵکو دەبێ لە ئەخلاق و ئاکارو ڕەفتارو هەڵسوکەوتی مامۆستایەکەی دەرس وەربگرێ، جا ئایا ئەگەر ئەو مامۆستایە بۆ خۆی ڕەسەن‌و چاك نەبێ، فەقێ‌وقوتابی چۆن لێی بەهرەمەند دەبێ؟!

## نۆيـــەم: دامـەزراوی و نەلـەخشـــاويی:

قوتابی زانستی شەرعيی دەبێ دامـەزراو و نەلـەخشـــاو بێ‌و وەك چڵەپووش بە دوای پشوەبای هەر شوبهەو شەهوەتێك نەكەوێ، ديارە ئەو دامـەزراوی يەش زياتر بە هۆی ئيـمانی دامـەزراوو عيـبادەتی باش‌و تەقوای چاكەوە كەسب دەكات، وەك خوای بەرزو بێوێنە فەرمووبەتی: ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَـوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ (ابراهيم-٢٧)، واتە: خوا بە هۆی قسەی پتەو (ئيـمان و عەقيدەی دامـەزراو)ەوە ئەوانەی ئيمانيان هێناوە لە ژيانی دونياو لە دوارۆژيشدا دامـەزراو و نەلـەخشـــاو دەكات...

## دەيـــەم: لەگـەڵ تەوژمی ئيســـلاميی دا بـــوون:

قوتابی زانستی شەرعيی دەبێ لەگەڵ خەڵكی ئيسلاميدا بێ‌و بە هيچ ڕەنگێك دروست نيەو نابێ لەگەڵ خەڵكی عەلمانيدا بێ‌و لەڕاستيدا لە نيشانەكانی ئاخير زەمانە كە فەقێ و مەلا لەگەڵ حيزبێكی عەلمانيدا بێ!!! بۆچی؟! چونكە: تۆ مادام قوتابی زانستی شەرعيی‌و ئيسلامييت، دەبێ هەر لەگەڵ ئەهلی شەرع‌و ئيسلاميشدا بی، من ناڵێم لەگـەڵ منی كۆمەڵی ئيسلاميی دا بە، نەء! بەڵكو دەڵێم: لەگەڵ كەسانێك‌و تەوژمێك‌و لايەنێكدا بە كە بۆ دينی خوا تێدەكۆشێ، جا هەر كەسێك هەيە با بێ، بەڵام نابێ تۆ لەگەڵ لايەنێك‌و كەسێكدا بی كە دژی ئەو زانستەو ئەو شەرع‌و

قورئانو ئیسلامەیە کە تۆ دەیخوێنی، وە دژی ئەو ئەخلاقەیە کە تۆ دەتەوێ زیندووی بکەیەوە!!

بەڵێ لە کاتی سەغڵەتیو ناچاریدا ساچاندن و مەداراکردن هەیە بەڵام لەگەڵدا بوونی دڵو هەڵوێست! ئەوە بێگومان پێچەوانەی ئەو شەرعو عیلمەیە کە تۆ دە یخوێنیو پێ چەوانەی چەندان ئا یەتی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (علیه الصلاة والسلام) کە ئێمە بەم دوو نموونەیە وازی لــێدێنین:

١- ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ۞ وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمْ الْغَالِبُونَ﴾ (المائدة/ ٥٥-٥٦)، واتە: بێگومـــان دۆستو پشتیوانتان تەنیا خواو پێغەمبەرەکـــەی و ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەنو ڕکووع دە بەن، وە هەرکە سێکیش دۆ ستایەتی خواو پێغەمبەرەکەیو ئەوانە بکات کە ئیمانیان هێناوە ئەوە کۆمەڵی خوایە- و بێگومان هەر کۆمەڵی خواش سەرکەوتون.

٢- ((یحشر المرء مع خلیله فلیَنظرْ أحدکم مَن یُخالل))(رواه الترمذي)، واتە: ئینسان لەگەڵ دۆستو خۆشەویستی دا حەشر دەکرێ، بۆیە با هەرکامێکتان سەرنج بدات لەگەڵ کێدا دەبێتە دۆست.

## تەوەرەی چوارەم: ئەرکی سەرشـــانی قوتابی زانیاری شـەرعیی بەرانبـــەر بە خــەڵك و کۆمــەڵگا:

برا فەقێ بەڕێزو خۆشەویستەکانم!

ئەم تەوەرەیەتان لە پێنج خاڵاندا بەکورتیو بە پوختی بۆ باس دەکەم:

### <u>یەکـــەم</u>: بڵاوکـــردنەوەی زانیـــاری شـــەرعیی:

یەکەمین کاری قوتابی زانیاری شـــەرعییو فەقێ ئەوەیە کە ئەو زانیاریەی وەری دەگرێ دوای ئەوەی کە بۆ خۆی کاری پێدەکات بڵاوی بکاتەوە، لەوبارەوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دە فـەرموێ: ((بلّغوا عنّي ولَو آيةً))[1]، واتە: "لە منەوە ئەگەر ئایەتێکیش بێ ڕایبگەیەنن"، بەڵێ، ئێمە بۆ هەڵسان بەکاری بانگەوازو کاری ئیسلامی مەرج نیە لە هەموو تاوان بپەڕینەوەو بڵێین دەبێ هـەرچی عیلمو زانیارییە وەدەستی بێنین- کە بێگومان مرۆڤ هەرگیز ناگاتە

(1) (رواه البخاري)

ئەو ئەنجامە- ئینجا دەست پێ بکەین!! بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە فێری دەبی باش فێری بی وە پاشان هەوڵ بدەی بە دەورو بەری خۆتی بگەیەنی، بەڵام بە لێزانیی و کارامەیی، ئەگەرنا لەنێو هاوەڵە بەڕێزەکانیشدا (خوا لێیان ڕازی بێ) هی وا هەبووە تەنیا یەك فەرموودەی لـێ گێڕراوەتەوەو هەشیان بووە سەدان، کەوا تە ئینسان پێویستە ئەو زانیارییەی کە بە دەستی دێنی خۆیشی کاری پێبکات و بڵاویشی بکاتــەوە.

هەموو شتێکیش بە لـێخەرج کردن کەم دەکات جگە لە عیلـم و زانست هەتا لێی سەرف بکەی زیاد دەکات!

## دووەم : تێکـەڵیی کردن لەگـەڵ خەڵـك و دەوروبــەر:

ئەرکێکی دیکەی ئێمە -وەك ئەهلی عیلم- ئەوەیە کە لە گەڵ خەڵكو کۆمەڵگای خۆمان تێکەڵ بین و پێیان ئاشنا بینو بچینە نێویانو لە خێرو شەڕو چاکەو خراپەیان ئاگادار بین، چونکە بەبێ ئەوە ئینسان لە دەوروبەرو کۆمەڵگــادا کاری بۆ ناکرێ، لەوبارەشەوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((المؤمِن الذي يخالط النّاسَ وَيَصبِر على أذاهمْ أفضَل مِنَ المؤمِنِ الذي لايخالِط الناسَ ولا يَصبِر على أذاهم)) (رواه الترّمذي وغيـره)، واتە: ئەو ئیماندارەی لەگەڵ خەڵکی تێکەڵی دەکات و ئارامیش دەگرێ لەسەر ئازارەکانیان- ئەو ئازارو نارەحەتییانەی کە لە دەستو دەمیان دەیبینیو دەیبیستێ- باشترە لەو ئیماندارەی کە دوورەپەرێز دەبێو خۆی لە گەڵ خەڵکی

تێكەڵ ناكات، زۆرجار مامۆستایانو مەلایانی ئێمە كە نەیانتوانیوە بە باشی كار لەو خەڵكەی دەوروبەریان بكەن بە هۆی ئەوە بووە كە لەگەڵ خەڵكەكەیاندا تێكەڵ نەبوونو ڕێگای دووریان نێوانیماڵو مزگەوت بووەو نەیانزانیوە لە نێو خەڵكیدا چ باسە!!

بەڵام بێگومان ئەوە پێچەوانەی عادەتی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) كە لە نێو جەرگەی خەڵك هەڵقوڵاون وەك خوای پەروەردگار لە بارەی پێغەمبەری كۆتاییەوە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ ﴾ (الجمعة-٢)، چونكە ئەگەر لەگەڵ ئەو واقیعو خەڵكەی كە تێیدا دەژی تێكەڵ نەبێ، ناتوانی كاریان تێبكەیو نازانی چاكەو خراپەو خێرو شەڕیان چی یە، تاكو فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەیان لەگەڵدا ئەنجام بدەی!

## سێیەم : پاكسازیی و چاكسازیی:

ئەركێكی دیكەی قوتابیانی زانستی شەرعیی ئەوەیە كە هەردەم خەریكی چاكسازیی و پاكسازیی كۆمەڵگاو دەوروبەریان بن و بژاری بكەن لە خراپەو بیڕازێننەوە بە چاكە. چونكە خوای كاربەجێ لەسەر كۆی مسوڵمانانی بەگشتی پێویست كردوە كە كۆمەڵێكیان تێدا هەبن فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە بكەن، واتە هەڵسن بە ئەركی پاكسازییو چاكسازیی لەنێو كۆمەڵگادا وەك فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران-١٠٤)، جا دیارە ئەهلی عیلمیش بە قوتابیو مامۆستا، یان فەقیو پێشەواوە، لە هەموو كەس لە

پێشــترن بۆ ئەوەی لە ڕیزی پێشەوەی ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردە یە بن کە هەڵدەستن بە بژارکردنو جوانکردنی کۆمەڵگاکەیان .

## چــوارەم : بووژاندنەوەی بەهــا بەرزەکانی ئیســلام :

ئەرکێکی دیکەی قوتابی و فەقێی زانستی شەرعیی ئەوەیە کە هەوڵ بدات بەها بەرزەکان لە ڕووی ئیمانو عەقیدە، لە ڕووی کلــتوورو فیکر، لە ڕووی ڕەوشت و ئەخلاق، لە ڕووی هەڵوێستی سیاسی و هەڵسوکەوتی کۆمەلایەتی و... هتدەوە لەخۆیدا بەرجەستە بکات، چونکە ئێمە دەبێ بە کردەوە سەرمەشق بین بۆ خەڵك، کاتێك باسی دادگەریی دەکەین، خۆمان دادگەر بین تاکو خەڵك عەدالەتمان تێدا ببینیو چاومان لــێ بکەن، وە کاتێك باسی دونیا بە کەمگرتن (زهد) دەکەین دەبێ خۆمان دونیا بە کەمگر بین و خەڵك دونیا بە کەمگرتنمان تێدا ببینێ. وە کاتێك باسی ئازایەتی دەکەین با خەڵك ئازایەتییمـــان تێدا ببینێ، وە کاتێك کە باسی خۆ بە کەمگرتن (تواضع) دەکەین با خــەڵك بە کردەوە خاکێتی مان تێدا ببینێ و... هتد، چونکــە ئەگەر ئێمە ئەو بەها بەرزانەی ئیســلام لە خۆماندا بەرجەستە بکەین زۆرجاران کردەوەو سیفەتەکانمان دەدوێن و ئەو بەرنامەو ڕێبازەی ئێمە بە خەڵك دەگەیەنن و تێیان دە گەیەنن، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾(التوبة -١٠٥)، واتە: وە  ئەی

موحه مەد - پێ یان ب فەرموو: کار ب کەن بێگو مان خواو پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کردەوە کەتان دەبینن..

## پێنجـەم : هەبوونی گیانی خۆبەخـتکردن و فیداکـاریی :

قوتابی زانیاری شەرعیی وەك هەر م سولمانێکی ڕا ستەقینە دەبێ گیانی فیداکاریی خۆبەختکردنی تێدا بێ، مامۆ ستا یاخود قوتابی وا هەیە لەبەر ئەوەی کە چاك لە وەزعەکـەی خۆی حالی نەبووە کە کێیەو دەبێ چۆن بێ، خۆی لە هەندێك قسـەی حەق دەپارێزێ لەبەر ئەوەی لەوە دەترسێ کە توو شی شتێك بێ، یان گرفتێکێ بۆ دروستبێ!! جا من وەسیەتتان بۆ دەکەم برایانی ئەهلی عیلم! کە هەمیشە قسەی حەق بکەن، بەڵام بە شێوەیەکی حەق و بە حەکیمانەو هەر گیزیش بێ ویژدان مەبن لەگەڵ خەڵك دا، بەڵام بەڕاستی ئینسان بە بێ ڕووحی فیداکاریی و بەبێ لەبەرچاو گرتـنی ئەوە کە تۆ دەبێ باج بدەی لەسەر دینداریی بەبێ ئەوە مسولمانەتیمان بۆ ناکرێ و ناتوانین بکەوینە شوێن پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بە تایبەتـی وەك ئەهلی عیلم، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو مسولمانان زیاترو لە پێش هەموویانەوە تووشی نارەحـەتی و ئازار بوون و لە دوای ئەوانیـش زانایان وەکو پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((أشدّ النّاس بلاءً الأنبیاء ثمّ

الأمثل فالأمثل...))[1]، واتە: کەسانێك کە لە هەموو کەس زیاتر تووشی بەڵاو گرفتاریی بوون پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، پاشان ئەوانەی لێیان نیزیکن پێ بەپێ... بۆیە ئەو کەســەی کە پێی وایە دەبێ ئەوەندەت حیکمەت هەبێ کە تووشی هیـچ بەڵاو گرفتێك نەبی! لەڕاستیدا ئەوە هەم لە مانای حیکمەتیش حاڵی نەبووەو هەم لە واتای دینداریش حاڵی نەبووە! چونکە بە تەئکید ئێمە لە ســەر دینداریکردن و پەیڕەوییکردن لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) تووشی نارەحەتیی دێین بۆیە دەبێ هەر لە سەرەتاوە عەزمانی لەسەر جەزم بکەین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین.

دیارە ئەگەر بە ڕاستییش بمانەوێ لە ڕیزی ئەو ئیمانداره چاکانەدا بژمێردرێین کە خوای بەرزو بێهاوتا لە وەسفیاندا فەرموویەتی:﴿ إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾(التوبة-١١١)، واتە: بێگومان خوا گیان و سامانی لە بڕواداران کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ.

کەواتە نابێ خۆمان بە خاوەنی گیان ومالی خۆمان بزانین لە بەرانبەر دینی خوادا، یانی لە هەرکات و جێگایەکدا دینی خوا پێویستی پێ بوو دەبێ گیانی خۆمانی لە پێناودا بەخـت بکەین و ماڵەکەشمانی لەسەر دانێین.

---

(1) رواه أحمد و البخاري والترمذي والنسائي وابن ماجه عن سعد بن أبي وقاص. (فيض القدير) ج /1 ص 662 ، رقم 1054، و رمز السيوطي لصحّته.

بەڵـێ دوای ئەوە ئنجـــــا دەبینە ئەو ئیمانـدارەی کە خـوای زاناو شارەزا (عزّوجل) مەدحی کردووین و مووژدەو بەڵێنی بەهەشتی پێ داوین.

## دوا وتـــەم

برا فەقێ یەکانم!

من دەزانم ئێستا لە کوردستاندا فەقێ و قوتابیانی زانستی شەرعیی زۆر بێنازن، وە قوتابخانە شەرعییەکانیشمان نەك هەر زۆر بێنازبوون، بەڵکو زەخت و فشاری زۆریان کەوتۆتەسەر!! وە ئەو دایك و بابانەی کە ڕۆڵەکانیان دەنێرنە بەر خوێندن و دەیانکەن بە قوتابی زانستی شەرعیی ئەگەر ئیمانداری باش نەبن ئەو کارە ناکەن، چونکە ئێستا کارێکی وا کراوە کە دونیا بە تێکڕا بەرەو ماددی گەرایی و بەرژەوەندی ماددی دەڕوا، لە ولاتی ئێمەشدا خەڵکی عەلمانی زۆر کورت بینانە لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا مامەڵە دەکەن و نازانن کە سەرەنجام هەرکات خوانەکردە کۆمەڵگا دینی تێدا نەما،

ڕەوشتو ئەخلاقیش نامێنێ و وەك لە شێکی بێ ڕۆح گە ندەڵ و بۆگەن دەبێ!

جا لە بەرانبەر ئەو زەخت و ف شارانەدا ئێ مە دە بێ خۆڕاگرو نەلەخشاو بین و ئەو هەموو موژدە خۆشـانەی کە لە لا یەن خواوە دراون بە ئەهـلی عیلم، قەرەبووی هەموو ئەو نارەحەتییانەمان بۆ بکاتەوە، دیارە تەنها ئێوەی (فەقێ)و (قوتابی)یش نین کە ئاوا لەژێر فشارو لە نارەحەتی دان، بەڵکو تەوژمی ئیسلامیی بە گشتی ئەوە حاڵیەتیو هەمووممان لەو ئێشو ژانو موعاناتەدا بە شدارین، بەڵام هەرکەسە بە جۆرێك!

ئنجا دەبێ دڵنیاش بین کە ڕۆژگار بە زۆر شێوە دە گۆڕێ و هەر خوا (جلّ شأنه) نەگۆڕەو ناگۆڕێ. ئەگەرنا هیچ کەس لە تایمێـــکدا نامێنێتەوە، خۆشی و ناخۆشی و تەنگانەو فەرحانی وەك شـەو و ڕۆژ بەدوای یەك دا دێـن و دەچن و جێگۆڕکە دەکەن!

ئنجا دەبێ ئێمەی مسوڵمان خۆشـەویستی خواو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)و ئیسلام ئەوەندە لە دڵماندا بەهێز بێ کە هەموو ئەو نارەحەتی و تاڵاییـــەمان لەبیر بەرێتـــەوە -انشاء الله - وە دەبێ ئیمانو بیروباوەڕمان ئەوەندە بەهێز بێ کە بتوانین بەسەر هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا زاڵبین تاکو سەرەنجام دەگەینە ئەو هەوارەی کە خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردوین- کە یان ئەوەتا شەریعەتی خوا لە ژیانماندا بەرپا بکەین، یان بەسەربەرزی لەژێر ئاڵای ( لا الـه الا الله محـمد رسول الله )دا ئەو ژیا نە پ ێنج و دوو ڕۆژەی دونیا مان

کۆتایی پێ بێنین. خوای داد گەرو بە بەزەیی سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

وصلى الله على محـمد وعلى الـه أجمعين والحمد لله رب العالمين.

## نیـوەڕۆك

## ئەم نامیلکەیە

لەم نامیلکەیەدا لەچوار تەوەرەداو لەبەررۆشنایی قورئان و سوننەتدا باسی : گرنگی و بایەخی زانیاری شەرعیی و ، پلەو پایەی بەرزی ئەهلی عیلم و ، کەسایەتی فەقێ و قوتابییانی زانیاری شەرعیی و ، ئەرکی سەرشانیان بەرانبەر بە خەڵك و کۆمەڵگایان کراوە .

هیواداریشم بەم نامیلکەیە سودێکم بە فەقێ و قوتابییانی بێنازی زانیاری شەرعیی کوردستان گەیاندبێ و ، دەستبارێکی خێرم بۆ گرتبن لەو ئەرکە قورس و پیرۆزەی سەر شانیاندا.






نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

www.al-tafseer.com
E-mail : tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2221695 - 2230908 - 2518138
موبایل : 07701387291 - 07504605122